# سەیرانگاو ژینگە

نووسین و سیناریۆ: کیفاح غازی
نیگار: دارا محەمەد عەلی


















زمارە ١٣٦ تشرینی دووەم
٢٠٠٧

# هەنگ

گۆڤارێکی مانگانەی منداڵانە
وەزارەتی رۆشنبیریی هەرێمی کوردستان
دەریدەکات

گۆڤاری هەنگ لەسەر سایتی
www.w-geocities.com/govar-heng
بخوێنەوە

HENG

*A children Monthly Magazine*
*Issued by*
*The Ministry of Culture*
*Kurdistan Region*

چاپ:
بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری - هەولێر



خاوەنی ئیمتیاز
**وەزیری رۆشنبیری**

سەرنووسەر
**حەمەساڵح فەرهادی**

بەڕێوەبەری نووسین
**گولەر حەبیب سیامەنسووری**

بەڕێوەبەری هونەری
**عەبدولقادر عەلی مەردان**

پیت چنین و دەرهێنانی هونەری
**ئاسۆ خالید**

ناونیشان: کوردستان - هەولێر - شەقامی
کەرکووک - تەنیشت بەڕێوەبەرایەتی گشتیی
رۆشنبیری و هونەر
مۆبایل ٤٤٩٥٦٠٨


بەرگی یەکەم: دلشاد عدلی

# ئاشتیخوازم

**هۆنراوەی: نەهرەوان محەمەد خالید**
**نیگار: هەژار سەلاح**

منم منداڵی نوێ
بە تەنیا ئاشتیم دەوێ
ئاشتی بۆ من و تۆیە
بێ ئەو ژین رەنجەڕۆیە
ئاشتی هیوایە هەردەم
لێی دانابڕێم هەتا هەم
دەڵێم من ئاشتیخوازم
هەر بەیەکبوون دەنازم
دەڵێم هەربژی کۆکی
نەفرەت بێ لە ناکۆکی




٤
ژمارە
١٣٦
تشرینی دووەم ٢٠٠٧

# داوای لێبووردن دەکەم

نووسینی: شاخەوان عەلی حەمەد
نیگار: ناسر فەتحی

ڕۆژێکیان فیلێک لە نێو دارستاندا زۆر برسی دەبێت و نازانێ بۆ کوێ بڕوات، لەڕقان بە توندی بەدارێک دەکەوێت کە ماڵی سمۆرەیەکی لێبوو. سمۆرەکە بە تووڕەییەوە دێتە دەرێ و بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات:

- فیلۆ... ئەوە بەم زلییە بۆ وا دەکەیت، دەڵێی چاوت ئەم دارە گەورەیە نابینێ؟!

فیلەکە بەکزییەوە دەڵێ:

- داوای لێبووردنت لێ دەکەم سمۆرەگیان، بەدەست خۆم نەبوو، زۆرم برسییەو بەرێی خۆم نابینم.

سمۆرەکە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ:

- نەڵێت قبووڵ دەکەم و نەڵێت دەبوورم.

فیلەکە سێ چوار جاری دیکە بە نەرمونیانییەوە داوای لێبووردنی لێدەکات، بەڵام سمۆرەکە لێی نابووری، تاکو مام ورچیان لێ پەیدا دەبێت و کە بەم کارە دەزانێت ڕوو دەکاتە سمۆرەکەو پێی دەڵێ:

- سمۆرەگیان، پێمخۆشە لێی ببووریت، ئەگینا ئەو کارەی ئەم دەکەوێتە ئەستۆی تۆ.

ئەم قسانەی مام ورچیش کاری تێ ناکات، تا ڕۆژێکیان سمۆرەکە بەتەڵەوە دەبێت و فیلەکە ڕزگاری دەکات.

سمۆرەکە هەست بە شەرمەزارییەکی زۆر دەکات، کە فیلەکە چەند لەبەری پاڕایەوەو داوای لێبووردنی لێکرد، کەچی لێی نەبووریبوو. بەم ڕووداوە سمۆرەکە لە هەڵسوکەوتەکانی پێشووی پەشیمان بووەوەو پەیمانی دا لەمەودوا داوای لێبووردنی هەموو کەسێک قبووڵ بکات.



# ژەهری شیرین

نووسینی: ئەحمەد سەلام       نیگار: پەخشان گەلالی



باپیری منداڵەکانم دەستی لە شیرینی خواردن هەڵنەگرت تا ئەنجام دای بە ئەرزاو هەمووی سێ ڕۆژ لەناوجێدا نەمایەوە کۆچی دوایی کرد. دوا ڕاپۆرتی پزیشکەکانیش هەر ئەوەی دەسەلماند کە بە نەخۆشیی (شەکرە) گیانی لە دەست داوە!

ئێستا باپیری منداڵەکان، خوا لێی ببوورێت، تەمەنێکی بەسەربردو چووە جێی هەقی خۆی، بەڵام بۆ نەگبەتی شیرنی خواردنی بۆ منداڵەکانم بەجێهێشتووە، ئەوەتا ڕۆژنییە بەرێی پزیشکەوە نەبم لەتاو دەم و ددانی ئەم و ئەویان. هەر جارێکیش پزیشکەکە دەم و ددانیان دەپشکنێ، ڕووی دەمی دەکاتە من و دەڵێ:

– فلانی، تا بۆت دەکرێ ئەم منداڵانە لە خواردنی شیرینی بپارێزەو نەیەڵی ئەوەندە توخنی شیرینی بکەون، ئەگەر حاڵ وا بڕوات دەم و ددانیان لەدەست دەدەن.

خۆشی لەوەدابوو کاتێک دوکتۆر ئەم قسانەی دەکرد (دانساز)ی کوڕم لەژێر دەستییا هەڵیدایەو گوتی:

– وەڵڵا بابە مامۆستاکانیشمان هەموو ڕۆژێک پێمان دەڵێن ئەوەندە شیرینی مەخۆن، چونکە زیان بە ددانتان دەگەیەنێت.

دوکتۆر بزەیەک گرتی و دەستێکی بەسەری (دانساز)دا هێناو گوتی:

– دەی باشە، بزانین لەمەولا بەقسەمان دەکەن.

بڕوابکەن من خۆم تا بۆم بکرێ شیرینی بۆماڵەوە ناهێنمەوەو لەبەر عەیبە نەبێت جەژنانیش نوقڵی جەژنانە ناگێڕم! بەڵام دەڵێی چی، تارمایی و دەستەڵاتی بازاڕ وا بەسەر هۆش و مێشکماندا زاڵ بووە، ئەگەر منیش نەیهێنمەوە، ئەوا ئەندامێکی تری ناو خێزانەکە هەڵپە دەکات و دەیهێنێتەوە.

ئیتر پێم ناڵێن چۆن نەخۆشیی شەکرەو ددان ئێشە لەماڵاندا بن بڕ دەبێت؟!






# قەدری جان

## ١٩١١ - ١٩٧٢

نووسینی: هوشیار عەبدوڵڵا



نووسەرو هۆزانڤان و چیرۆکنووس و وڵاتپارێز (قەدری جان) ناوی تەواوی (عەبدولقادر محەمەد عەزیز جان)ە، ساڵی ١٩١١ لەشارۆچکەی (دێرکا چیایێ مازی) سەر بە ویلایەتی (مێردین) لە باکووری کوردستاندا لەدایکبووە. کاتێک کە لەساڵی ١٩٢٨دا لە شاری (قۆنیا) قوتابیی خانەی مامۆستایان دەبێت، لەبەر زوڵم و ستەمی حکوومەتی ئەوسای تورکیا لەگەڵ خوالێخۆشبوو (ڕەشیدێ کورد) ئاوارەی دەڤەری (جەزیرە)ی وڵاتی سووریا دەبن و لە شاری (عامودا) نیشتەجێ دەبێ، پاشان دەکرێتە مامۆستاو ڕەوانەی شاری (ئەنتاکیە)ی دەکەن، لەو شارانەشدا مامۆستایەتیی کردووە: عامودا، قامیشلۆ، عەین دێوار، پاشان بۆ شاری (دیمەشق) دەگوازرێتەوەو لەوێ لە (گەڕەکی کوردان - تاخا کوردان)دا مامۆستا بووەو پاشان کراوەتە فەرمانبەر لە وەزارەتی پەروەردە.

قەدری جان زۆربەی بەرهەمەکانی لە شیعرو چیرۆک و وتار لەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییانەی ئەوکاتی کە لە وڵاتی سووریاو لوبنان و عێراق دەردەچوون وەکو (ڕۆژانوو، هاوار، ڕوناهی و گەلاوێژ) بلاوکردووەتەوە.

قەدری جان ساڵی ١٩٧٢ لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) نێژراوە.

خوالێخۆشبوو دوو کوڕی بەناوی (مزگین) و (سروور)و کچێکی بەناوی (شیرین) لە دوای خۆی بەجێهێشتووەو ئێستا شیرین خان پزیشکەو لە شاری دیمەشق نیشتەجێیە.

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

### دێرک

دێرکا چیایێ مازی — وەلاتێ باڤ و کالە
لێ سەد هاوارو گازی — ژێ دوورکەتم چەند سالە
ئەز لەوێ هاتم دنێ — وێ دەرگووشێ هەژاندنم
هەی داخ، هەی مالا منێ — دژمنان ژێ ڕەڤاندم

سەرچاوەکان:
١- قەدری جان، ژیان و بەرهەمی، مەریوان عومەر/ سلێمانی.
٢- قەدری جان، دلاوەر زەنگی - هەولێر/ ٢٠٠١.




تشرینی دووەم ٢٠٠٧

# یاریی تۆپ و نیگەرانی

نووسینی: فەرهاد قادر ئۆمەر
نیگار: دارا محەمەد عەلی

**مندالە خۆشەویستەکان**

وەک دەزانن وەرزش لەژیانی ئێمەدا زۆر گرنگەو یارمەتیی گەشەپێدانی بەهرەو کارامەیی دەدات و دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ماسوولکەکانی لەش، بەتایبەتی یاریی تۆپی پێ، کە مندالآن بە حەزو ئارەزوویەکی زۆرەوە دەیکەن، بەلآم هەندێک جار دەبێتە مایەی نیگەرانی و هەراسانکردنی خەلّک، ئەمەش لەو کاتەدا دەبێت کە شەقام و ڕێگا گشتییەکان دەکەنە شوێنی یاریکردن و گوێ بەهیچ بنەمایەکی دروست نادەن و دلّی هەموو ئەو کەسانە دەڕەنجێنن کە بەم شوێنەدا تێدەپەڕن و تۆپیان بەردەکەوێت. هەروەها دەبێتە هۆی پێشێلکردنی یاساکانی هاتوچۆو ڕێگر دەبێت لەبەردەم تێپەڕبوونی ئۆتۆمبیل. سەرەڕای ئەوەش یاریزانەکان خۆشیان تووشی مەترسیی بەرکەوتنی ئۆتۆمبیل دەبن.

خۆشەویستەکانم:

لەشارە خۆشەویستەکەماندا شوێنی تایبەتی هەیە بۆ ئەوانەی ئارەزووی یاریی تۆپی پێ دەکەن، کە دەتوانن بە دلّنیاییەوە یاریی تێدا بکەن و دووربکەونەوە لە مەترسی و خەلّکیش نیگەران نەکەن، وەک ناوەندەکانی لاوان و قوتابییان و گۆڕەپانەکانی وەرزش و گۆڕەپانی قوتابخانەو شوێنی چالاکییە وەرزشییەکان.






# مشکی زۆرخۆر

و. لەفارسییەوە: شکۆ بەرزنجی
نیگار: بەخشان گەلالی

کونێک لەدیواری چێشتخانەی ماڵێکدا هەبوو، ئەوکونە ماڵی  یک بوو...

مشکەکە بەیانی تا شەو هیچ کارێکی نەبوو جگە لە خواردن و خواردن خواردن. شەوێکیان  ەکە کونەکەی

هاتە دەرەوەو بەناو چێشتخانەکەدا سووڕایەوە، لەوکاتەدا چاوی بەسەر مێزێک کەوت، کە پڕبوو لە




مشکەکە دەستی بە چاوی داهێنا تا بزانێت ئەم هەموو خواردنە خۆشە خەوە یان ڕاستییە؟!

کە دڵنیابوو ڕاستییە دەستی کرد بە گوێزانەوەی خۆراکەکان بۆ ناو کونەکەی خۆی.

یەکەمجار ەکانی برد، لە ڕێگادا قەپی لە یەکێکیان گرت، لە دڵی خۆیدا گوتی

بەڕاستی زۆر بەتامە، با هەر لێرەدا هەمووی بخۆم. دەستی کرد بەخواردنی و تەواوی کرد.

ئینجا ڕۆیشت تا ەکان بباتە ناو کونەکەی، لە ڕێگادا یەکێک لەگوێزەکان کەوتە

خوارەوەو شکا. ەکە گوتی: تازە ئەمەیان بۆ خۆی شکا، باشتر وایە بیخۆم... دەستی کرد

بە خواردنی، لەبەرخۆیەوە گوتی بەڕاستی گەلێک بەتامە، کەوایە بۆ هەموویان نەخۆم.

کاتێک ەکانیشی خوارد، چوو بەرەو قاپە کان تا بیانباتەوە

بۆ کونەکەی خۆی.

دۆندرمەکان بۆنێکی زۆر خۆشیان هەبوو، ەکە زمانی دەرهێناو هەندێکی لێ لێستەوە، ئەمانیش زۆر

بەتام بوون، بۆیە گوتی: وا بابزانم باشتر وایە هەموویان لێرە بخۆم. ئیدی دانیشت و هەموو  کانی

نۆش کرد.






پاش ئەوە مشکەکە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، تەنیا  کان مابوونەوە،

ویستی بیباتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، بەڵام بەخۆی گوت من کە هەموو  و  و

 کانم خوارد، ئیتر بۆچی ئەم نەستەلانەش نەخۆم؟ دەستی کرد بە خواردنی کانیش.

پاشان کە ەکە خەیاڵی ئاسوودە بوو و تێری خوارد هەستی کرد سکی دێشێ و ناتوانێ بجووڵێت!

لەوکاتەدا لەناکاو دەنگێکی بیست، پاش کەمێک خۆی کرد بەناوچێشتخانەکەدا. ەکە ویستی

هەڵبێت و خۆی بشارێتەوە، بەڵام سکی ئەوەندە قورس و گەورە بووبوو نەیتوانی لە جێی خۆی تەکان بدات.

 هەرکە چاوی بە مشکەکە کەوت، تا هێزی تێدابوو هاواری کرد:

 ە، ە، ە!

مشکەکە هەر چۆنێک بوو خۆی گەیاندە بەردەم کونەکەی، بەڵام هەرچەندی کرد نەیتوانی بە کونەکەدا بچێتە ژوورەوە... لەم ساتە وەختەدا باوکی خۆی گەیاندە ناو چێشتخانەکە، ەکە کە زۆر ترسابوو، هەرچۆنێک بوو بەهەزار زەحمەت لە چێشتخانەکە ڕایکردە دەرەوەو خۆی دەربازکردو ئیتر بۆ هەمیشە لەو چێشتخانە پڕ لە و و و یە دابڕاو هەرگیز نەیوێرا جارێکی دیکە بۆی بگەڕێتەوەو کەس لەوێ نەیبینییەوە.

سەرچاوە: ئینتەرنێت (بەکەمێک دەستکارییەوە).




تشرینی دووەم ٢٠٠٧

# خۆشترین ماڵ و وڵات

نووسینی:
قاسم محەمەد مستەفا
نیگار: مجید خدر

ماسی و نەهەنگ و سمۆرەو چۆلەکە چوارگیانلەبەرن. (نوا)و (بالا) پرسیارێکییان لەهەر یەک لەم گیانلەبەرانە کردو گوتییان بەڕای ئێوە کام ماڵ خۆشەو چ وڵاتێک خۆشترین وڵاتی جیهانە؟

ماسی گوتی: ڕووبار شوێنی لە دایکبوونی منە، من هەر لەوێ ژیاوم و بەڕای من ئەو شوێنە خۆشترین ماڵ و وڵاتە لە جیهاندا.

نەهەنگیش لەوەڵامدا گوتی: دەریاکان پانوپۆڕترین شوێنن و لە دەریا نەبێت ژیانی من و هاوڕێکانم ئەستەمە، بۆیە لای من ئەم شوێنە خۆشترین ماڵ و وڵاتی جیهانە.

سمۆرەی تووکن و چاوگەش گوتی: کۆلکە داری زل و قەد ئەستوور خۆشترین ماڵ و وڵاتە، چونکە من ماڵی خۆم و بێچووەکانمی تێدا دروستدەکەم و تێیدا دەحەوێینەوە، بۆیە لای من خۆشترین ماڵ و وڵاتە لەم جیهانەدا.

لە کۆتاییدا چۆلەکەکەش بەجریوەجریو هاتە وەڵام و گوتی: سەر چڵ و لق و پۆپی دارو درەختو و شوێنە بەرزەکان خۆشترین ماڵ و وڵاتی منن، چونکە هێلانەو ماڵی خۆم و بێچووەکانمی تێدا دەسازێنم، بۆیە لەلای من خۆشترین ماڵ و وڵاتی جیهانن.

لەکۆتاییدا نواخان و کاکە بالا گوتییان هەریەکێک ماڵ و وڵاتی خۆی پێ لە هەموو شوێنێک خۆشترە، بۆیە لای ئێمە خۆشترین وڵات لەم جیهانەدا کوردستانە.






# کیسەڵ و مشک



و. لە عەرەبییەوە:
قەیسەر عەبدوڵڵامحەمەد

نیگار:
دارا محەمەد عەلی

کیسەڵێکی بەساڵاچوو لە دوورگەیەکی خۆڵاوی، لە کانیاوێکی دوورگەکە، لەناو داروبەردا دەژیا، لەگەڵ ئەم کیسەڵە مشکێکی سپڵە دەژیا، ئەو مشکە هەردەم دژایەتیی کیسەڵەکەی دەکرد، تا وای لێهات کیسەڵەکە بڕیار بدات ئەو دوورگەیە بەتەنیا بۆ مشکەکە بەجێ بهێڵێت.

مشکە سپڵەکە گوێی بە ئازارەکانی کیسەڵەکە نەدەدا کە لە ئەنجامی ڕەفتارە خراپەکانی دەرهەقی دەکرد، بەردەوام مشکەکە بەکیسەڵەکەی دەگوت زەویی خوا زۆرەو فراوانە، دوورگەش زۆرن...

ئەو ڕۆژەی کیسەڵەکە بڕیاری دا دوورگەکە بەجێ بهێڵێت، هاتە لای مشکەکە خواحافیزیی لێ بکات. مشکەکە گوێی پێ نەدا، هەروەک نەیناسیبێت و ئاشنای یەکتر نەبووبن.



کیسەڵەکە بەهەڵسوکەوتی مشکەکە زۆر خەمباربوو و ئازارەکانی لە ناخدا قورستربوو، چونکە مشکەکە تەنانەت لەکۆچکردنیشدا ڕووی پێ نەدا.

پاش کەمێک باران باری و زۆربەی دوورگەکە نوقمی ئا و بوو، کانیاوەکەش ئاستی ئاوی بەرز بووبووەوە، مشکەکە لەترسی خنکان خۆی بەدارێک هەڵواسیبوو، ئەو دارەش هێدی هێدی نوقمی ئاوی کانییەکە دەبوو.

کیسەڵەکە هات لەسەرپشتی خۆی داناو بردییە سەر وشکانی و ڕزگاری کرد.

ئینجا مشکەکە زانی کیسەڵەکە زۆر بەکەڵکی هات، بڕیاری دا ببێت بەهاوڕێی.




سەرچاوە: مجلة (العربي الصغير) العدد ١٧٦، مايس ٢٠٠٧.

# دیدارێک لەگەڵ بێژەرێکی منداڵاندا

ئا: پەیامنێری گۆڤاری (هەنگ)

**(محەمەد مەجید ڕواندزی) بەهرەمەندێکی دیاری دنیای منداڵانەو ماوەیەکە وەکو ئامادەکارو پێشکەشکارێکی سەرکەوتوو لەهەردوو کەناڵی ڕادیۆو (T.V)ی زەحمەتکێشان کاردەکات، جگە لەوەی تا ئێستا چەندین شیعرو چیرۆکیشی نووسیوەو وەکو پەیامنێریش کاری کردووە.**

گۆڤاری (هەنگ) لە نزیکەوە بەچەند پرسیارێک محەمەدی دواند:

**پ١: یەکەم کارت کەی بوو و چ بەرنامەیەک بوو؟**

و: یەکەم کارم (گوڵزاری منداڵان) بوو، دواتر خونچەکانی T.V بەدواداهات، جگە لە نووسین ودانانی ژمارەیەکی زۆر لە شیعرو چیرۆک.

**پ٢: لەکاتی پێشکەشکردنی بەرنامەکانتدا هەست بەچی دەکەیت؟**

و: بێگومان هەست بەخۆشی دەکەم، دیارە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ منداڵان تایبەتمەندیی دەوێت و دەبێ خۆت وەکو منداڵ لێ بکەیت.

**پ٣: تا چەند لە بەشی منداڵانی ڕادیۆو T.V ییەکان ڕازیت؟**



و: ئەو ماوەیەی بۆ منداڵانیان تەرخانکردووە زۆر کەمەو کەموکورتیشی زۆرە، بۆیە من و چەند کەسێکی بواری منداڵان بیرمان لە دامەزراندنی ڕادیۆیەکی منداڵان کردەوە، بەڵام بەهۆی گرفتی دارایی و هاوکاری نەکردنی حکوومەتی کوردستان نەمانتوانی.

**پ٤: ئەی چالاکییەکانت؟**

و: جگە لە ئامادەکردن و پێشکەشکردنی چەند بەرنامەیەکی جۆراوجۆرو بڵاوکردنەوەی چیرۆک و شیعرەکانم لە گۆڤاری (هەنگ، هێلانەی منداڵان، مێرگی منداڵان و پەلکەزێڕینە)، تا ئێستا ٧٠-٨٠ شیعری منداڵانم نووسیوە، نامیلکەیەکم ئامادەیە بۆ چاپ، هەموو هەفتەیەکیش بۆ ماوەی (٤٠) خولەک لەبەرنامەیەکدا بە منداڵان شاد دەبم و هەردوو ڕۆڵی (مام پووشۆ و محەمەد) هەر خۆمم.








# مامە ئەدیسۆن

هۆنراوەی: هاشم خۆرانی
نیگار: شیلان عەبدوڵڵا

مندالّەکان، کامتان وێنەی
مامە (ئەدیسۆن)تان دیوە؟
گەنجینەیەکی بەبەهای
بەئێمەی مرۆڤ بەخشیوە

* * *

ئەوەبوو توانی بەژیریی
سەرتاپا دنیا خەڵات کا
بەرەنج و زانست و بیری
دوارۆژمان پڕ لە ئاوات کا

* * *

زانایەکی بلیمەت بوو
ئەو بوو کارەبای داهێنا
ژیانی کردە چراخان
لە تاریکایی دەرهێنا

* * *

خۆزگە ئێوەش لە دوارۆژدا
هەروەک ئەدیسۆن بوونایە
بەزانست و کاری بەسوود
ناوتان وەک ئەو دەرکردایە

* * *

بۆ وڵات و هەموو دنیا
وازرینگ و بەهێز دەبوون
لەنێو دڵی هەموو کەسێک
خۆشەویست و بەرێز دەبوون





# پاییز

ژماره ١٤
١٣٥

هۆنراوەی: مستەفا ئێلخانی زادە/ بۆکان
نیگار: پەخشان گەلاڵی

دیسان پاییز هاتەوە
بەخۆشی و بەهاتەوە

وەرزێکی خۆش و جوانە
جوان و لەبەر دڵانە

بە پیت و بەرەکەتە
پڕ لە ڕزق و نیعمەتە

لەم وەرزە میوە زۆرە
هەیە لە هەموو جۆرە

هەنجیرو هەرمێ و هەنار
سێوو قۆخی مەزەدار

وەرزی ڕاووشکارە
وەرزی خۆشی جووتیارە

بەرهەم کۆدەکاتەوە
بۆ ماڵێی دەباتەوە

دەچنەوە قوتابخانە
لەبۆ خوێندنی وانە

قوتابیی ژیرو هوشیار
شاد دەبنەوە بە دیدار








# کۆلارە


هۆنراوەی: خاڵند ئەحمەدی- بۆکان
نیگار: دارا محەممەد عەلی


با دێ، با دێ
کۆلارەکەم
بەهێزی با
وە حەوا خەم

* * *

لە قاقەزەو
سووکە وەک کا
هەڵدەسووڕێ
بە ئەمری با

* * *

لە حەوایە
سەمادەکا
وەک تووک ئەم لاو
ئەولا دەکا

* * *

تۆزێ بەنی
بۆ شل دەکەم
ئەوانی دی
وە دوا دەخەم

* * *

کۆلارەکەم
دەڕواتە بان
تاکو داگیر
دەکا ئاسمان

* * *

جوانەو دەڵێی
باڵندەیە
کۆلارەکەم
پەڕندەیە

* * *

ئێستا کاتی
ئێوارەیە
کایەو بەزمی
کۆلارەیە



# چیرۆکەکەی ئازا

نووسینی: ئاشتی ڕەحمان
نیگار: هیوا عەبدولعەزیز

ئازا کوڕێکی تەمەن دە ساڵان بوو، باوکی نەمابوو، لەگەڵ دایکی لە دارستانێکدا دەژیا.

ئازا تابڵێی لاسار بوو، هەرگیز بەقسەی دایکی نەدەکردو بەردەوام هاوڕێکانی و گیانداری ئەزیەت دەدان.

شەوێکیان ئازا زۆر ماندووبوو، هەر بەجلی دەرەوە چووە ناو جێگاکەی تا بخەوێ، دایکی پێی گوت: کوڕی شیرینم جلەکانت بگۆڕە، ئەمە جلی خەوتن نییە، بەڵام ئەو قسەی دایکی بەهەند هەڵنەگرت و گوتی جلی ماڵەوەو دەرەوە هیچ جیاوازییەکیان نییە.

ئازا ماوەیەک هەر لای چەپ و ڕاستی کردو شوێنی سەرینەکەی گۆڕی هەر خەوی لێ نەکەوت، بۆیە بە بێزارییەوە بە دایکی گوت: دایکە چیرۆکێکم بۆ بگێڕەوە.

دایکی گوتی: هەبوو نەبوو کوڕێک هەبوو ناوی ئازا بوو.

ئازا قسەی دایکی بڕی و بەسەرسوڕمانەوە گوتی: ئا.. وەکو من ناوی ئازا بوو؟!

دایکی ئازا: بەڵێ کوڕێکی جوان و ئێسک سووک بوو وەکو تۆ، بەڵام زۆر خەڵکی ئەزیەت دەداو ئاژاوەی دەنایەوەوهەرگیز گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی دایکی نەدەبوو.

ئازا گوتی: بۆ چیی دەکرد؟

دایکی ئازا بەهێمنی دەستی کرد بەگێڕانەوەی کارە خراپەکانی ئازا: هەرکاتێک منداڵانی گەڕەک یارییان بکردایە، ئەو کەلوپەلی یارییەکانی لێ تێهەڵدەدان.

ئازا قسەی دایکی بڕی و گوتی: ئا ئینجا دەچوو هەندێک کەلوپەلی لێ دەبردن و پاشان لە دوورەوە گاڵتەی پێدەکردن و دەیگوت: گەر وەک من ئازان وەرن بیانبەنەوە.

دایکی ئازا، بەڵێ، بێجگە لەمەش زوو زوو لە ڕێگەی قوتابخانە شەڕی بە کەروێشک دەفرۆشت و لێی دەدا...

ئازا بەپەرۆشەوە گوتی:






بەخێرایی ڕایدەکردە ماڵەوە، کە دایکی کەروێشکیش دەهاتە لای دایکی ئازا، ئەو دەیگوت: من لێم نەداوە، درۆ دەکات.

دایکی ئازا: بەڵێ وابوو، لەقوتابخانەش هەر ئاوا ئاژاوەگێڕ بوو، ڕۆژێکیان لەورچی هاوپۆلی دابوو، خستییە مل کۆتر، لەئەنجامدا مامۆستا کۆتری سزادا.



جارێکیشیان کاغەزی قۆپیەی خستبووە ناو دەفتەری ئاکامی هاورێی.

دیسان ئازا قسەی دایکی بڕی و گوتی: لەکاتی تاقیکردنەوەدا مامۆستا قۆپیەکەی لە ئاکام گرت و سزای دا، ئازاش گاڵتەی پێدەکردو دەیگوت قۆپیەچی، شەرم ناکەی قۆپیە دەکەی؟

دایکی ئازا: جارێکیشیان کورسیی سەگی بۆیە کردبوو، ئەویش بەم کارەی ئازای نەزانیبوو، لەسەر کورسییەکە دانیشت، هەموو جلی دواوەی بووبووە بۆیە.

ئازا: ئازاش دەیگوت ئەوە چییە هاوڕێ خۆت پیس کردووە؟!

دایکی ئازا: ئازای لاسار لەم کارە نابەجێیانەی بەردەوام بوو، تا ڕۆژێکیان لە قوتابخانە دەگەڕایەوە ماڵەوە...

دایکی سەیری کوڕەکەی کرد، بینی خەوی لێکەوتووە، بەزەردەخەنەوە سەری لەقاندو



هەستا ڕووناکیی ژوورەکەی کوژاندەوە.

ئەوشەوە ئازا لە خەونیدا لەقوتابخانە دەگەڕایەوە ماڵەوە، قاچی لەبەردێک گیربوو، لە ئاکامدا کەوتە سەرزەوی و قاچی چەپی ئەزیەتی پێگەیشت و بریندار‌بوو، زۆر هاواری کردو گریا: ئای باوکە قاچم... دایکە قاچم شکا، فریام کەون!

بەڵام هیچ کام لە هاوڕێکانی بەهانایەوە نەهاتن ، بەڵکو گاڵتەیان پێدەکرد.

ئاکام گوتی: ئای چەند بەستەزمانی، وابزانم هەرگیز باوەڕت نەدەکرد ئاوات بەسەربێت.

ورچ بەهەڵپەڕینەوە دەیگوت: ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟ کێ لێی داوی... من...؟!

کۆتر دەیگوت: کێ وای لێکردووی تا سزای بدەین... من؟... نە باوکە.



دوای گاڵتەپێکردنێکی زۆر بەجێیان هێشت و ئازا بەتەنیا لەناو دارستان مایەوە... ڕۆژ ئاوابوو، ئاسمان هێدی هێدی تاریک دادەهات، دەنگی سەیر سەیر دەهاتە بەرگوێی، ئازا لەترسان هەموو لەشی دەلەرزی و دەگریا، لەناکاو شێرێک بە نەڕەنەڕ بەدیارکەوت، ئازا لەم کاتەدا قیژاندی و لەخەو هەستا.

دایکی بەدەنگی ئازا بەخەبەر هات،ڕووی کردە ژوورەکەی و لە باوەشی گرت و گوتی: چیتە کوڕی خۆم بۆ دەقیژێنی؟

ئازا بەترس و لەرزەوە گوتی: دایکە هاوڕێکانم زۆر خراپ بوون، منیان بە تەنیا بەجێهێشت تا شێر بمخوات.

دایکی ئازا لەسەرخۆ گوتی: هەموو کەسێک دەبێ بەپێی کردەوەکانی چاوی لەدەستی بەرانبەرەکەی بێت.

ئازا هێور بووەوەو گوتی: ڕاست دەکەی دایکە، من هیچ کاتێک کردەوەکانم جێگەی ڕەزامەندیی هاوڕێکانم نەبووە، بۆیە ئەوان هەقیانە گەر لە چۆڵەوانی بەجێم بهێڵن، بەڵام لەمەو دوا باش دەبم تا ئەوانیش لەگەڵم باش بن.

# تەبایی سەوز و زەرد

نووسینی: عەلی بەختەوەر
نیگار: دلشاد عەلی

ماڵی ئازاد دوای ئەوەی کە خانووە نوێیەکەیان تەواوبوو، گواستیانەوە ئەوێ. بەمەبەستی جوانکردن و ڕازاندنەوەی دیمەنی باخچەکەیان، باوکی ئازاد بیری لەڕواندنی هەندێک نەمام و دارو گوڵ کردەوە.

ڕۆژێکیان باوکی ئازاد چوو لە نەمامگەیەکدا هەندێک دارو گوڵی کڕی، لەناویاندا نەمامە پرتەقاڵێکیشی لەگەڵدا بوو، هەمووی لە باخچەکەیدا ڕواند.

دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک دار پرتەقاڵەکە پێگەیی و هاتە بەرهەم، سەرەتا بەرهەمەکە لەشێوەی تۆپێکی سەوزدا خۆی دەنواند.

ئازاد ڕۆژانە سەیری دیمەنی ئەو تۆپە سەوزە جوانەی دەکردو چێژی لەبینینی وەردەگرت، چاک دەیزانی ڕەنگی سەوز نیشانەی ژیان و زیندەگی و بەهارو خۆشییە، ئەمەو بەشێک لەئاڵای کوردستانیش سەوزە.

ماوەیەک ڕابرد، ڕۆژێکیان ئازاد سەیری دار پرتەقاڵەکەیانی کرد، بینی پرتەقاڵە سەوزەکە کە جاران لەشێوەی تۆپێکی سەوزدا خۆی دەنواند، گۆڕاوە بووەتە (زەرد)و وێنەی خۆر دەدرەوشێتەوە... ئەم گۆڕانە ئازادی بچکۆلانەی سەرسام کرد! خێرا لەباوکی پرسی:

- بابەگیان پرتەقاڵەکەمان جاران سەوز بوو، نازانم ئێستا بۆ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە؟!

باوک: کوڕم ئەم گۆڕانە نیشانەی گەورەبوون و پێگەیشتنە، کاتێک پرتەقاڵ پێدەگات زەرد هەڵدەگەڕێ و تامی مزرو خۆش دەبێ، سوودبەخشیشە بۆ لەش.



ئازاد: بابەگیان، زەردیش وەکو سەوز ڕەنگێکی جوانە، ئەو دووڕەنگەش ئاڵاکەمانیان نەخشاندووە.

باوک: ئافەرین ڕۆڵە قسەکەت وایە... سەوزو زەرد پێکەوە جوانن.

# هێلکەی دۆڕاو و جووجەڵەی وریا



نووسینی: ئەحمەد حوسێن ئەحمەد
نیگار: پەخشان گەلالی

مریشکە زەردە لەناو پووشوپەڵاشێکدا هێلکەیەکی کرد، مارێک هات و ڕاوی نا، ئەویش پەنای بردە بەر کەڵەشێرو پێی گوت: ئەگەر فریا نەکەوی ئەو مارە هێلکەکە دەخوات.

کەڵەشێرەکە بە قووقە قووق ڕایکرد بۆی، مارەکە خۆی ونکرد.

لەولاوە پوورە زەیتوون بە بۆڵە بۆڵ لەمریشکە زەردە توورە بوو، گوتی: بێخێر بۆ هێلکە دەدۆڕێنی؟

کەڵەشێرەکە قووقاندی... پوورە زەیتوون خۆی گەیاندە شوێنی دەنگەکە، هێلکەکەی بردەوەو نیشانەی کردو تێکەڵ بە هێلکەی مریشکەکانی تری کرد.

کاتێک مریشکە زەردە کڕ کەوت و هێلکەکانیان خستە ژێری، هێلکە دۆڕاوەکە جووجەڵەیەکی سپیی لێ دەرچوو. پوورە زەیتوون پێی گوت: خنجیلانەکەم، تۆ هێلکەیەک بوویت دایکت لەشوێنێکی هەرە دوور کردبووی، خەریکبوو مار بتخوات، فریاتکەوتین، تکایە ئەگەر پێگەیشتی و هاتیتە هێلکە وەک دایکت مەبە، لە کولانەکە دوور مەکەوە.

مریشکە زەردەش گوتی: جگەرگۆشەکەم، پوورە زەیتوون ڕاست دەکات، تازە من وا ڕاهاتووم، دەبێ هەموو مەلێک سنووری کارو چوونە دەرەوەی خۆی بزانێت. ئیدی جوجکە سپی بوو بە نموونەی چینەکەرێکی ماڵی و بەکەڵک.



# بزنمشک

ئا: سەدرەدین خۆشناو
فۆتۆ: هەژار هیرانی



**منداڵە خۆشەویستەکان**

ئەم وێنەیەی لەبەرچاوتانە وێنەی (بزنمشک)ە، کە سەرێکی درێژو چوارپەل و کلکێکی درێژی هەیە. بزنمشک گیانلەبەرێکی خشۆکەو لەشی بە سیرمە داپۆشراوە، وەکو مارو تیمساح و مارمیلۆک و قومقومۆک (خەمەگرو)و پیسپیسۆک و کیسەڵ. یەکێک لە خەسڵەتەکانی خشۆک ئەوەیە کە ڕەنگی پێستیان بە گوێرەی دەوروبەرو ژینگەکەی دەگۆڕن.

لەڕاستیدا نێوی بزنمشک (بزن مژەک)ە، بەڵام لە ئەنجامی زۆر گوتندا لەسەر زار بووەتە (بزنمشک)... بەڵام دیارە ئەم گیانلەبەرە دوورە لە بزن، چونکە (بزن) گیانلەبەرێکی شیردەرەو لەشی بە موو داپۆشراوە...

ناوی (بزن مژەک)یش لەبەر ئەوەیە هەر لەو ساتەی بزن چاوی پێ بکەوێت یەکسەر ڕادەوەستێ، ئەمیش دەستبەجێ شیری گوانی دەمژێت و یەک دڵۆپەی تێدا ناهێڵێ.

بزنمشک لە کوردستاندا هەیە، بەتایبەتی لە ناوچەی خۆشناوەتی.

# خۆزگە



خۆزگە منیش وەکو هەر منداڵێکی ئاسایی ئایندەم دیار دەبوو.

**هونەرمەند (تەحسین ئیسماعیل ڕەسووڵ) ناردوویەتی**




# پەیمانی منداڵی ژیر

هۆنراوەی:
محەمەد عەبدوڵڵا مێرگەیی - چۆمان
نیگار: هەژار سەڵاح



ئەی دایە چرای ناوماڵ
یەکەم باوەشی منداڵ
ساباتی پڕ هێمنی
دایەگیان چاوی منی
ئامێزی گەرم و سۆزت
ڕەفتاری زۆر پیرۆزت
بۆمنی زارۆی بچووک
بوون بە فێرگەی پڕ پەڕتووک
ئەی دایەی ماندوونەساس
ژیان پڕ تاسەو کەساس
سوێندبێ بەخوای میهرەبان
تاکو ماوم لە ژیان
بەد ڕەفتاری نەنوێنم
هەرگیز دڵت نەشکێنم
بۆ تۆ ببم بە سابات
لە ڕۆژی هات و نەهات



## هاوڕێی ئێوەم

**هۆنراوەو نیگار: ژیلیا سەعدەدین**
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (بالەک) چۆمان

من گوڵزارم گوڵزارم
هاوڕێی ئێوەی نازدارم
خنجیلانەو ڕاستگۆمە
هۆگری خاکی خۆمە
جلم گەلێ جوانە
بۆسەماو بۆ سەیرانە
ڕەنگی پەمەیی ئاڵە
بۆ ژیانم خۆش حاڵە





**ئاشتی سابیر عەلی**
پۆلی سێیەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (شەرەفخان)ی تیکەڵاو



**خەندە ئیبراهیم جەعفەر**
پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (بیتوێن)ی نموونەیی/ هەولێر






بەرهەمی ئازیزان
ژمارە ٢٣
١٣٦
تشرینی دووەم ٢٠٠٧




**میران شێروان**
پۆلی یەکەمی سەرەتایی



**ئەحمەد ئیبراهیم جەعفەر**
پۆلی سێیەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (بیتوێن)ی
نموونەیی/ هەولێر



# پەشیمانیی ڕامیار

**نووسینی: ژیتە هەژار** پۆلی: شەشەمی سەرەتایی

ڕامیار کوڕێکی زۆر پیس و تەمبەڵ بوو، حەزی دەکرد هەموو کاتێک لە کۆڵانان یاری بکات، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک هاوڕێی ئاقڵ و ژیری هەبوو کە زۆر حەزیان لە خوێندن بوو و هەموو ساڵێک لەخولەکانی هاوین بەشدارییان دەکرد.

هاوڕێکانی زۆر ئامۆژگاریی ڕامیاریان دەکرد بۆ ئەوەی زۆربەی کاتەکانی خۆی لە کۆڵان بە فیڕۆ نەدات، بەڵام ڕامیار گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی ئەوانی نەدەکرد، بۆیە ڕۆژێک لەسەر شەقام ئۆتۆمبێلێک خۆی پێدا دەدات و ڕامیاریش لە هۆش خۆی دەچێت و دەیبەن بۆ نەخۆشخانە.

کاتێک هاوڕێکانی بەمەیانزانی زۆر خەمبار بوون و لە نێوان خۆیاندا هەندێک پارەیان کۆکردەوەو چەپکێک گوڵی جوانیان بۆ کڕی و بە دیاری بۆیان برد.

دوای ئەوەی ڕامیار بەهۆش خۆی هاتەوە، سەیری کرد هاوڕێکانی بە دەورییەوەن زۆر دڵخۆش بوو، هەر ئەوکاتە پەیمانی پێدان کە چیتر نەچێتە کۆڵانان و ئەویش لەگەڵ ئەواندا بەشداری ئەو خولانە بکات کە لە پشووی هاویندا دەکرێنەوە.



# کاتێکی خۆش



## ڕێگا دۆزینەوە

ئا: مەهاباد خەلیل

بەکام ڕێگا ئەم
منداڵە دەچێت
یارییەکەی خۆی
دێنێتەوە؟

## تەمەنت بە ژمارە بزانە

ئا: رزگار مامە

دەتوانیت لە ڕێگای ئەم یارییەوە کاتێکی خۆش لەگەڵ هاوڕێکانتدا بەسەر ببەی:
داوا لەیەکێک لە هاوڕێکانت بکە کە تەمەنی خۆی لەسەر کاغەزێک بنووسێت، بەبێ ئەوەی نیشانی تۆی بدات، پاشان:

١- ژمارەکە جارانی دوو بکات (×٢).

٢- ئەنجامەکە چەند بوو (٥)ی بۆ زیاد بکات. (+٥).

٣- دیسان ئەنجامەکە چەند بوو جارانی (٥٠)ی بکات. (×٥٠).

٤- ئەنجامەکە چەند بوو بیخاتە سەر تەمەنی خۆی.

٥- ئەنجامەکە چەند بوو (٣٦٥)ی بۆ زیاد بکات. (+٣٦٥).

٦- ئەنجامەکە چەند بوو (٦١٥)ی لێ دەربکات. (- ٦١٥).

ئێستا دەبینین ئەنجامەکە یەکسانە بە ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی کە پێشتر لەسەر کاغەز نووسیبووی.

تێبینی:
ئەگەر ئەنجامەکە چوار ڕەنووس (ڕەقەم) بوو، ئەوا ڕەنووسی یەکەم و دووەم (یەکان و دەیان) یەکسانە بە تەمەنەکە، ئەگەر ئەنجامەکەش سێ ڕەنووس بوو، ئەوا ڕەنووسی یەکەم (یەکان) یەکسانە بە تەمەنەکە.

سەرچاوە: مجلة (المزمار) العدد/١٤ - ١٩٨٣/٤/٢.



# کاتێکی خۆش

## هەڵێن

ئا: ڕێکان پشتیوان

هاوینە هەوارێکی باشووری کوردستانەو لە (٧) پیت پێکدێ:

١- پیتەکانی (٣) و (٢) و (٤) ناوی باڵندەیەکی ڕەشە.

٢- پیتەکانی (٤) و (٥) و (٣) بەمانای قاچ دێت.

٣- پیتەکانی (١) و (٢) و (٥) پێچەوانەی ڕۆژە.

٤- پیتەکانی (٣) و (٥) و (٦) و (٧) وەکو چا دەخورێتەوە.

ئایا ناوی ئەو هاوینە هەوارە خۆش و دڵگیرەی کوردستان چییە؟

شیکار:

## پێکهێنانی ڕستەی بەسوود

ئا: بنار هادی

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ | ١٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پ | ک | ێ | و | ش | ر | م | د | ە | س | ر | ت | گ | ا | ە | ن | ی |

ئەگەر پیتەکانی ژمارە تاکەکان بەجیاو پیتەکانی ژمارە جووتەکانیش بەجیا دەربێنی، دەستەواژەیەکی خۆشەویستت دەست دەکەوێ.

شیکار:

تاکەکان:

جووتەکان:

## جیاوازی

ئا: شادیار هیوا

پێنج جیاوازی لە نێوان ئەم دوو وێنەیەدا هەیە بیاندۆزەوە:







# هاوڕێیەکی بەهرەمەند

ئا: عوسمان محەمەد هەورامی

**جگەرگۆشە نازدارەکان:**

بێگومان یەکێک لە بوارە زۆر پیرۆزو بە نرخەکان، خوێندنەوەو نووسینی زۆرباش و جوان و بەسوودە... بەڕاستی مایەی شانازیی هەموو لایەکە، ئێوەی ژیرو هوشیار لەم بوارەدا هەنگاوی زۆر باشتان ناوەو ئەوەندەی دیکە جیهانە جوان و گەشەکەی خۆتان ڕازاندووەتەوە.

ئازیزان، لەم بوارەدا هاوڕێیەکی چالاکتان گەلێک شادە، کە خۆی بەئێوەی چاوگەش بناسێنێت... ئەوەبوو لە دیدارێکی خنجیلانەدا، چەند پرسیارێکمان لێکرد، ئەویش بە سوپاسەوە گوتی:

- ناوم (شلک عەبدوڵلا ڕەئووف)ە، تەمەنم (٨) ساڵە، خەڵکی شاری (سلێمانی)م، وام لە قوتابخانەی (سوورکێو)ی سەرەتایی، لەپۆلی سێیەمدام.
- دایک و باوک و مامۆستاکانم زۆر هانم دەدەن بۆ ئەوەی بخوێنمەوەو بنووسم.
- زۆر ئارەزووم لە نووسینی هۆنراوەو چیرۆکەو بەرهەمێکی زۆریشم هەیە.
- پڕ بەدڵ بەختەوەری و سەرکەوتن بۆ هەموو هاوڕێکانم دەخوازم و هیوادارم دوارۆژێکی ڕوون و گەشیان هەبێت.
- ئەم هۆنراوەیەم پێشکەشە بە هەموو خوێنەرانی گۆڤاری (هەنگ)ی نازدار.

## پەپوولە

من پەپوولەی ڕەنگینم
زێڕو زەڕی سەنگینم
منم، منم، هاوڕێتان
هەر ڕووناکیم بۆ ژیان
ئەی گوڵە ڕەنگینەکان
دێم بۆ لاتان هاوڕێیان
منم، منم، پەپوولە
هاوڕێی ئێوەی بچکۆلە



